# ئاسۆی منداڵان

9
ئەیلوول 2005

گۆڤارێکی مانگانەیە، وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێم دەری دەکات




**خاوەن ئیمتیاز**
**عەبدولعەزیز تەیب**

**سەرنووسەر**
**ئەحمەد قەرەنی**

**بەڕێوەبەری هونەری**
**دارا محەمەد عەلی**

**دەستەی نووسەران**
دلێر ئیبراهیم
سەگڤان یوسفی

**کۆمپیوتەرو فەرزی ڕەنگەکان**
دلشاد عەلی
جومعە سدیق کاکەڕەش
عاسف مزوری

**سەرپەرشتیاری چاپ**
زاگرۆس مەحموود

**ڕاستنووسین و زمان**
شێرکۆ ئەحمەد حەوێز
ئەنوەر حوسێن مەسیفی

**ناونیشان**
هەولێر- وەزارەتی پەروەردە
**تەلەفۆن:**

سەرنووسەر
٢٢٣٠١٣٥ - ٤٥١٢٧١١
بەڕێوەبەری هونەری:
٢٢٢٤٠٠١ - ٤٦٥٩١٥٤
بەدداڵە
٢٢٣٣٠٨٤-٢٢٣٣٠٨٥
فاکس : ٢٢٣٠٤٧١

فەرزی ڕەنگ و چاپ: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - هەولێر






# گیانلەبەران لە مەتەڵی کوردەواریدا

ئا: ڕەشید حوسێن خۆشناو

منداڵە جگەرگۆشەکان..
ئەوەی خوارەوە کۆمەڵە مەتەڵێکی کوردەوارییە، هەریەکەیان لەبارەی گیانلەبەرێکەوە گوتراوە، بە وردی بیانخوێیننەوە، ئینجا هەوڵ بدەن لە ماوەیەکی کورتدا بە هێڵێك وەڵامە ڕاستەکان بەیەکتر بگەیەنن.

١-سەری مارە، زگی بەرخە، پشتی کارە، کلکی مەقەستە.

٢-شەش پەڕ و دوو چاوە، دوژمنی ڕۆژ و هەتاوە.

٣-ڕەشە کار نییە، جۆ دەخوا ئاژەڵ نییە، دیوار کون دەکا دز نییە.

٤-مامەکم هەیە لە دەشتێ، حەفسەد کونی لە پشتێ.

٥-ڕەشە وەك قیری، سپییە وەك شیری، لەڕێ دەڕوا وەك وەزیری.

٦-داپیرێکم هەیە لە دەشتێ، کەچە شیرەکی لە پشتێ.

٧-پشتی ڕەقە بەرد نییە، هێلکە دەکا مریشك نییە، سەری درێژە مار نییە.

٨- باڵدارە و شیردەرە، بەشەو دیارە بەڕۆژ بزرە.

٩-چاوی وەك ئاسکە، لەشی وەك پڵنگە، دەستی وەك شێرە.

١٠-عەشیرەتێك هەن ناوچەوانیان زەرد، هەموویان سوورن وەك گوڵی بێگەرد.


مێرووولە


حاجی لەقلەق


دووپشك


شەمشەمەکوێرە


کیسەڵ


ماسی


هەنگ


پەڕەسێلکە


ژووشك


بۆق

# دڵۆپی ئاو

نا: عەبدوڵڵا نەجمەدین- سلێمانی
نیگار: مریەم عەبدوڵڵا




دوای ئەوەی شنە زۆر ماندوو بوو بوو، زۆری نەخایەند و هێشتا چاوی نەچووبووە خەو، لەپڕ گوێی لە دەنگێکی نەساز بوو:

تەق ... تەق... تەق

شنە، لەپڕ هەستا و سەیری ئەملاوئەولای خۆی کرد، بەڵام هیچی بەدی نەکرد. جارێکی تر خەوتەوە.



پاش چەند چرکەیەك دەنگەکە دەستی پێکردەوە، ئەمجارەشیان هیچی نەدی، ئەویش بڕیاریدا بەدوای سەرچاوەی دەنگەکەدا بگەڕێت.

پاش پشکنین و گەڕان سەرچاوەکەی دۆزییەوە. سەیری کرد بەلوعەی سەر سنگەکە دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لێ دەتکێت و دەڕژێتە ناو جامێکی فافۆنەوە و ئەو دەنگە ناخۆشە دروست دەکات. شنە، بەلوعەکەی گرتەوە و، دەنگەکەی کپ کرد.

پاشان بە خۆشحاڵییەوە نووستەوە، بەڵام پێش ئەوەی چاوی بچێتە خەو، بڕیاری دا هەموو شەوێك پێش خەوتن، بەسەر بەلوعەکاندا بگەڕێت و بەجوانی بیانگرێتەوە، هەتا دەنگی ناخۆش دروست نەکەن و ئاویش بەفیڕۆ نەڕوات.



# ناودارانی جیهان

## جان سباستیان باخ

منداڵە ژیکەڵەکان..

چۆنن.. باشن...

ئەمن ناوم (جان سباستیان باخ)ە.

بە باشترین هونەرمەند لەمێژووی مۆسیقای جیهان دادەنرێم.

کاتێ وەك ئێوە منداڵ بووم لە خێزانێکی مۆسیقا دۆست لەدایك بووم و لە تەمەنێکی بچووکدا فێری ئامێرەکانی کەمان و پیانۆ و زۆربەی ئامێرە مۆسیقییە ژێدارەکان بووم.

لە تەمەنی ( ١٠)ساڵیدا بووم، کاتێك باوکم کۆچی دوایی کرد و ناچار براگەورەکەم سەرپەرشتی ئێمەی گرتە ئەستۆ.

ئازیزان..

من بەهۆی هەوڵ و کۆشش و بروا بەخۆبوون، توانیم پەرە بە هونەری مۆسیقای ئەوروپی بدەم و لە مۆسیقای چەرخە ئایینییە ناوەڕاستەکاندا بیگەینمە چڵەپۆپە و هەروەها توانیم ڕەهەندی تازە بە مۆسیقا ببەخشم کە پشت بە (زانستی ئاواز) دەبەستێت.

بەرهەمی (ئازارەکان) بە یەکێك لە گرنگترین بەرهەمەکانم دادەنرێت کە لە کتێبی (ئینجیل) ی پیرۆز وەرم گرتووە و چیرۆکی حەزرەتی عیسا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەرجەستە دەکات.

ئازیزان..

من لەماوەی ژیانمدا( ٢٠) منداڵم هەبووە ( ١١کوڕ و ٩کچ ) و چەندین پارچەی مۆسیقاشم لەبواری هونەری منداڵاندا ئامادە کردووە کە بەرهەمی ( پەڕتووکی مۆسیقییە بچووکەکان ) بەناوبانگترینیانە.

# سەیرو

ئا: بێتوش محەمەد



پەپوولە هەستی بۆنکردنی
لە هەردوو قاچی دواوەیدایە.



برژانگی چاوی مرۆڤ دوای نزیکەی
سەد و پەنجا ڕۆژ نوێ دەبێتەوە.



فیل خواردنی یەك ڕۆژی (١٣٦) کیلۆگرامە.





# سەمەرە




مێشکی مرۆڤ نزیکەی ( ١/٣) کیلۆگرامە و لە سێ بەش پێکهاتووە.





مێروولە توانای هەڵگرتنی ( ٥٠) ئەوەندەی جەستەی خۆی هەیە، هەڵبگرێت.





خێراترین و وریاترین گیانلەبەر بۆ بیستن گوێدرێژە.



## Learn This Song

## فێری ئەم گۆرانییە ببە

# منژ هەنگم



# I am a Bee

مِن هەنگێکم زۆر بەباشی کار دەکەم
لەگەڵ هەموو هاورێکانم لەم شانەیەدا
مِن کرێکارم , شەوو رۆژ کاردەکەم
تاکو هەمووڕمان بتوانین لێرە بژین

* * *

I am a bee and I work very hard
With all of my friends in this hive
I am a Worker, I work day and night
So that all of us here can survive

ئێمە هەموو رۆژێك بۆ شاژنەکەمان کار دەکەین
خواردن کۆدەکەینەوە و شانەکان دروست دەکەین
دەنکە هەڵاڵە و هەنگوین دەخۆین بۆ بنیاتنانی شانەکان
هەروەها خواردن بە کرمۆکەکانیش دەدەین

* * *

We work for our Queen Bee every day
We gather the food and build cells
We eat pollen and honey to build up our glands
And we feed the young larvae as well

* * *

جا کە ئێستا ئێوە دەزانن چی لە شانەکا نماندا هەیە
هەروا هەندێك لەو کارانەش کە ئێمە دەیکەین
هیواداڕین ئێوە لە ئێستا بە دواوە تێبگەن
کە وشەی " وەکو هەنگ پڕ ئیشن" چەند ڕاستە!

* * *

So, now that you see what it's like in our hive
And know some of the work that we do
We hope from now on that you'll all understand
That the word (Busy as a Bee) are so true!



و: مەڕوان کاکل

# فەرهەنگی وێنەدار

## ئینگلیزی - کوردی



هەوڵ بدە لە کەمترین کاتدا
ئەو ناوانەی لەژێرەوە نووسراون
بە ئینگلیزی و بە کوردی
لەژێر وێنەکان بیاننووسیتەوە.











**گێزەر، ترێ ، هەرمێ، خۆخ، پرتەقاڵ، لیمۆ**

peach , pear , orange , lemon , grape , carrot

# قوتابیان و کەلوپەلی قوتابخانەیان



٥ × ٧



٩ + ٨



١٥٠ ÷ ٢



١٠ × ١٠



٦ × ٦



٢٥ + ٢٥



١١ + ٢٣



٦٠ − ٨



٥٠٠ ÷ ١٠



٤٤ − ٨



١٧ × ٢



٢٢٠ − ١٢٠



١ + ٥١



٧ × ٥



٣٥ + ٤٠



٢٠ − ٣

یارمەتی ئەم قوتابیانە بدە بۆ دۆزینەوەی کەلوپەلەکانیان، بەگوێرەی ئەنجامی ئەو ژمارانەی کە لەژێر وێنەکان دەردەچن.

# کتێبخانەی ئاسۆی منداڵان




خۆشەویستان..
لەم ڕۆژانە چەند گۆڤارو کتێب و بڵاوکراوەی منداڵان چاپکران،
لێرەدا هەندێك لەو چاپکراوانە دەخەینە ڕوو:

### شەماموك

گۆڤارێکی منداڵانەیە لە شاری ئامەدی کوردستانی باکوور دەردەچێت.

### سڤۆرە

گۆڤارێکی منداڵانەیە لە شاری دهۆك لەلایەن دەزگای خانی بۆ ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن دەردەچێت. لەم ڕۆژانە ژمارە ( ٧٢)ی بەچاپ گەیشت .

### گوڵەگەنم

هژمارا ( ٩) ژ گۆڤارا گوڵەگەنم دەرکەفت کو ژ وەشانێن سەنتەرێ خاتوزینە و تایبەتە بە زارۆکان .

### هەنگ

هژمارا ( ١٠٨) ژ گۆڤارا هەنگ دەرکەفت کو وەزارەتا رەوشەنبیری دەردئێخیت بۆ زارۆکان .

### گەشتی فریشتەکان

کۆمەڵەکێ هۆزان و چیرۆکانە ژ بۆ زارۆکان ژ نڤیسینا ماموستا (عەلی بەختەوەر)ە.

### ڕیڤی و مریشکا سۆر

کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵانەیە لەلایەن بەڕێز (محەمەد مەلا حەمدی) وەرگێردراوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی .

# منداڵە خۆشەویستەکان توانا و زیرەکی خۆتان تاقی بکەنەوە

نا: د.کەریم شەریف قەرەچەتانی

ئەم کاتەتان شاد و بەختەوەر ..
ئێوەی خۆشەویست، گۆڤار و رۆژنامە و کتێب دەخوێننەوە، لە قوتابخانە قوتابین یان لەوانەیە هەندێکتان خوێندنی تەواو نەکردبێ، بەڵام زانیاری و شارەزایی باشی لەبارەی ژیان و کۆمەڵ و زۆر شتی ترەوە هەیە. ئینجا بۆ ئەوەی بزانین ئێوەی خۆشەویست تا چەند سوودتان لەو زانیاری و پرۆگرام و وانە و گۆڤار و کتێبانە وەرگرتووەو تا چەند دەتوانن لە دەرەوەی قوتابخانەدا سوودیان لێوەربگرن، ئەوا لەم ئەلقەیە بەدواوە لە هەموو ژمارەکانی گۆڤارەکەتان، گۆڤاری (ئاسۆی منداڵان) هەرجارەی کۆمەڵێك پرسیارتان لێدەکەین و هیواداریین تەنیا خۆتان بەبێ پرسکردن بە کەسوکار و هاورێ و مامۆستاکانتان، وەڵامیان بدەنەوە، بۆ ئەوەی زیرەکی و توانای خۆتان تاقی بکەنەوە.



پ ١- چ وشەیەك لەم (٥) وشانەی خوارەوە ((یان چ شتێك لەم (٥) شتانەی خوارەوە)) لەگەڵ (فرۆکە) دەگونجێ، واتە پەیوەندی نێوان (بەلەم) و (ئاو) وەك پەیوەندی نێوان (فرۆکە) و یەکێك لەم (٥) شتەی خوارەوە وایە، باشە ئەو شتە کامیانە؟ ئایا (رۆژ)ە یان (زەوی)یە یان (ئاو)ە یان (هەوا)یە یان (دارودرەخت)ە؟

وەڵام: پەیوەندی نێوان (بەلەم) و (ئاو) وەك پەیوەندی نێوان (فرۆکە) و (هەوا)یە، لەبەر ئەوەی کاتێك بەراورد دەکەین و لێی ورددەبینەوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەلەم بەناو ئاودا دەڕوا، کەواتە فرۆکەش بەناو هەوادا دەفڕێت و، وەڵامەکانی دیکە ڕاست و گونجاو نین.

پ ٢- پەیوەندی لەنێوان شێوەی ○ و شێوەی ⦶ وەك پەیوەندی نێوان شێوەی □ و یەکێك لەم شێوانەی خوارەوە وایە، کامیانە؟



وەڵام: شێوەی ژمارە (٢) واتە ◫ لەبەر ئەوەی لە پرسیارەکە بازنەکە ○ بووە بە دوو بەش واتە هێڵێك بەناویدا هاتووە، کەواتە دەبێت ئەو شێوەیەش کە وەك چوارگۆشەکە ◫ وابێت و پەیوەندی لەگەڵی هەبێت، کرابێت بە دوو بەشەوە کە ئەویش تەنیا لەشێوەی ژمارەی (٢) هەیە، واتە شێوەکانی (١، ٣، ٤، ٥) گونجاو و ڕاست نین.

پ ٣- لەخوارەوە پێنج شت (وشە) هەیە، بزانم دەزانیت یەکێکیان لەو پێنج شتە جیاوازە و لە ئەوانی دیکە ناچێ، کامیانە؟

١- سەگ ٢- ئۆتۆمبیل ٣- پشیلە ٤- باڵندە ٥- ماسی

وەڵام: ئەو شتەی کە جیاوازەو لە چوارەکەی دیکە ناچێ (ئۆتۆمبیل)ە، لەبەر ئەوەی چوارکەی دیکە (سەگ و پشیلە و بالندە و ماسی) هەموویان گیاندارن و دەخۆن و هەناسە دەدەن و دەخەون، بەڵام ئۆتۆمبیل بێ گیان و مردووە و وەك ئەوان نییە.



پ ٤- وا لەخوارەوە پێنج شێوە هەیە، یەکێکیان جیاوازە و وەك ئەوانی دیکە نییە، بزانم دەزانی کامیانە؟



وەڵام: شێوەی ژمارە (١) واتە بازنەکە ◯، لەبەر ئەوەی شێوەکانی دیکە هەموویان بەهێڵی ڕاست دروست کراون، بەڵام بازنەکە بە هێڵی چەماوە دروست کراوە.

پ ٥- کام ژمارە لەم ژمارانەی خوارەوە لەگەڵ ژمارەکانی دیکەدا ناگونجێت و وەك ئەوان نییە؟

١، ٣، ٥، ٧، ٩، ١٠، ١١، ١٣

وەڵام: ژمارەی (١٠)، لەبەر ئەوەی هەموو ژمارەکانی دی تاکن، تەنیا ژمارە (١٠) جووتە و لەگەڵیاندا ناگونجێ.



منداڵە خۆشەویستەکان ..

ئێستا دوای ئەوەی وەڵامی پێنج پرسیارم بۆ دانەوە، هیوادارم فێربوبیت و بزانیت ئەم جۆرە پرسیارانە چۆن وەڵام دەدرێنەوە. کەواتە هەر لە ئێستاوە خۆت بۆ پرسیارەکانی ژمارەکانی داهاتووی گۆڤارەکەتان (گۆڤاری ئاسۆی منداڵان) ئامادە بکە و بزانم چۆن بە سەرکەوتووانە وەڵامیان دەدەیتەوە، داواکارم بۆ ژمارەکانی داهاتوو سوود لەم وەڵام و ڕوونکردنەوانەی ئەم ژمارەیە وەربگرن و وەڵامەکانی خۆشت بپارێزە تا کۆتایی هەموو ژمارەکان و دوای تەواو بوونی پرسیارەکان، وەڵامەکانتان بۆ ئاشکرا دەکەین و ڕیژەی زیرەکی خۆشتان بۆ دەنووسین.

# بۆ زاخاوی مێشك

منداڵە خۆشەویستەکان :
هزری خۆتان بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ڕاست و
دروست بەکاربهێنن .




ئەزموونی یەکەم:
لەم ( ٩) وێنەیەدا (٣) دانەیان لەگەڵ ( ٦)
وێنەکانی تر جیاوازن ، هەوڵ بدە بیاندۆزیتەوە :

ئەزموونی دووەم :
لە ناو ئەم سێ بازنەیەی خوارەوەدا ژمارەیەك بزرە، هەوڵ بدە بیدۆزیتەوە
بۆ ئەوەی ئەو زنجیرەیە بە دروستی تەواو دەرچێت.




ئەزموونی سێیەم:
دەستنیشانی ماسییە جیاوازەکە بکە.




نا: نازاد حەمەشەریف

# ئەزم کچا کوردا



ئەزم کچا کوردا
بلند ڕادگرم ئالا
ئەڤ ئالاێی ڕۆژ د ناڤدا
خەملاندیە ب سێ ڕەنگا
بۆ خاترێ ناڤێ ئالا
دێ خوینم دەم و گاڤا
دا کوردستان وەکو وەلاتا
پێشکەڤیت هەموو گاڤا
کەس نەبێژیت تو قەرەچی
چ ئەزبم چ تو بی بێ جودا
خویندن و پەروەدە
مافێ مە هەمیا
زارۆك و پیرو جحێلا
ل هەمی تەخ و چینا

مادەم هەیە کوردستان
ماف هەیە هەمی کەسان
کەس ل من نەنێریت
ب چاڤەکێ کێم
فەلەکێ نەهێلا ئەم رونین
ل چ جهان
فەلەکێ نەدهێلا ئەم زارۆکێت
قەرەچان بخوینین
ئاکنجی ببین ل چ جهان




هۆزانا: فاخیر ئیسلام
مامۆستایێ قوتابخانا
دوریان ئالوکا
نیگار: عادل زرار


# ئاگر


هۆنراوەی: کازم کۆیی
نیگار: مریەم عەبدوڵڵا


بڤە بڤە دەسوتێی
نەکەی نەکەی واوەبێی
ئەمە ئاگرە ڕۆڵە
دەتسوتێنێ بەرخۆڵە
ناچم ئاگرە ناچم
دەسوتێ دەست و قاچم





نووسینی: شەوبۆ یەحیا خدر
نیگار: شنۆ یەحیا

# پیرەژنێکی غەوارە

لە یەکێك لە گوندەکانی ئەم کوردستانەی خۆماندا، پیرەژنێکی پەڕیوەی غەوارە هەبوو، ئاسوودەیی و ئارامی لە خەلکەکە هەلگرتبوو. دەگەڵ کەسیدا هەلنەدەکرد، چاوی بەکەس هەلنەدەهات. زۆری درۆ بە پەتێوە دەکرن. تا وای لێهات خەلکی گوندی بەقێز و بێزەوە لێیان دەڕوانی. پیرەژن هەدادانی نەبوو، هەمیشە لە نارەحەتی خەلکی دەگەڕا و حەزی دەکرد گوندەکە بەخەلکی چۆڵ کات و وەك خۆی پەڕیوەی ئێرەو ئەوێیان کات.

تا ڕۆژێکیان نوێژی نیوەڕۆیەکی کش و مات، هات و هاوار و بابەڕۆی لی هەستا:

ئەی هاوار، ئەی هاوار.. سەڵاو قەت کەس نەماو خۆم، خەلکینە نەکەن، دەستی منو دامێن.. کانیی شیرناو، ژەهراوی بووە و زیندەوەری لی قوتار نابێ، کە ئاوی کانییە شیرناوییان خواردۆتەوە.

بەڵام خەلکەکە دوودلی قسەو گفت و ڕەفتارەکانی بوون.. دەشترسان، ئەوە ڕاست بوو!!؟ پاشان کوڕەلاوێکی بەجەرگ و بوێری گوندی گوتی:

خزمینە، خۆ من لە کوێرە دایکێکی زیاتر چ کوڕ و کچ و ژن و کەس و کارێکی دیکەم نییە لەپاشم بەجێ بمێنێ، من خۆم دەکەمە قوربانیی خەلکی ئەم ئاواییە و، ئاوی کانییە شیرناوێ دەخۆمەوە، ئەگەر مردم، ئەوە ئێوە و پیرەدایکە کوێرەکەم و خودای خۆتان، بە هەمووان چاودێرییەکی بکەن و، بیکەنە دایکی خۆتان، ئەگەر نەشمردم، ئەوە دەبێ خەلکەکەی ئاسوودە کەین و پیرەژن ئێرە بەجێ بێلێت و بۆ کوێ دەچێ بچێ.

ئەو شۆڕە لاوە جامە ئاوی لە کانییە شیرناوێ پڕ کرد و بەسەری خۆیەوە نا، تا چۆڕەبڕی کرد. کە دوای یەك دووسەعاتان دەرکەوت ئاوی کانییەکە وەك جاران پاك و بێگەرد و ڕوون و شیرناوە.. هەر هەمان کوڕەلاو، پیرەژنی برد، سواری ئێسترێکی لاکەوتەی وەك خۆی پیر و لەڕ و لاواز کرد و جلەوی دایە دەستی و لە ئاواییەکەی وەدەرنا.. ئەوجا خەلکی گوندی کەوتنە کۆش و باوەشی ئاسوودەیی و ئارامی سەرلەنوێی خۆیانەوەو کیژێکی شایستەشیان بۆ ئەو شۆڕە لاوە خۆبەختکەرەی ئاوایی خواست و ماڵ و حالێکی خۆشیشیان بۆ دانا..

منداڵانی ئاواییش هێشتا هەر پێیان وایە پیرەژن هەروا لە ئێسترەکەی نەهاتۆتە خوارێ و هەروا بەڕێوەیە.



# ژمارەی گونجاو

ئازیزان.. ژمارەی گونجاو لە شوێنە بەتاڵەکان دابنێن.



# فێربوونا ئەلفبێیا کوردی ب تیپێن لاتینی

Berhevkirina Xelîl Duhokî

## Ş-ş

| Şo | re | şa | kur | da | ser | ke | ti | ye |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

| Şoreşa | kurda | serketiye |
|---|---|---|

Şoreşa kurda serketiye.







## T-t

| Ta | va | ro | jê | ger | me |
|---|---|---|---|---|---|

| Tava | rojê | germe |
|---|---|---|

Tava rojê germe.

| Hh | Ii | Îî | Jj | Kk | Ll | Mm |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ھ | بزرۆکە | ی | ژ | ك | ل | م |
| Ûû | Vv | Ww | Xx | Yy | Zz | |
| وو | ڤ | و (بێ دەنگە) | خ | ی (بێ دەنگە) | ز | |

# Fêrbûna elfbêya kurdî bi tîpên latînî



## R-r

| Rê | nas | Çû | qu | tab | xa | nê |
|---|---|---|---|---|---|---|

| Rênas | çû | qutabxanê |
|---|---|---|

Rênas çû qutabxanê.

## S-s

| Si | la | van | li | ba | bê | xwe | bi | ke |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

| Silavan | li | babê | xwe | bike |
|---|---|---|---|---|

Silavan li babê xwe bike.



| A a | B b | C c | Ç ç | E e | D d | Ê ê | F f | G g |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئا | ب | ج | چ | ه | د | ێ | ف | گ |
| N n | O o | P p | Q q | R r | S s | Ş ş | T t | U u |
| ن | ۆ | پ | ق | ر | س | ش | ت | و |

# لەگەڵ دوو بەهرەمەندی بچکۆلە



تارا مەجید

لارا ، تارا مەجید خۆشناو دوو خوشکی بەهرەمەندی بچکولانەی بەتواناو لێهاتوون لە بواری هونەری مۆسیقاو شێوەکاری، جگە لەمەش تارا لەگەڵ خوشکی گەورەی میدیا ئەمساڵ لە دووەمین فیستڤاڵی شانۆی منداڵان لە شاری دهۆك، بەشداری شانۆگەری ( ڕاوچییە نەفرت لێکراوەکە)ی وەك ئەکتەرێکی بەتوانا کرد، کە لە نووسینی مامۆستا هیوا سوعادو لە دەرهێنانی مامۆستا سامان بوو

بۆ زیاتر ئاشنابوونمان بەم دوو خوشکە بچکۆلانەیە، ئەو چاوپێکەوتنە کورتەمان لەگەڵدا سازکردن:

❊ تارا خان یەکەم بەرهەمی هونەریت، چی بوو؟

ـ پیشانگایەکی تایبەتی خۆم بە (٥٠) تابلۆ لە ڕۆژی جیهانی منداڵان لە قوتابخانەکەم لە عەنکاوە کردۆتەوەو هەروەها لارای خوشکیشم بە (٢٠) تابلۆ بەشداری پیشانگایەکی لە باخچەی ساوایانی بەهەشت کردووە.

❊ کێ هاندەرتان بوو؟

ـ باوکم، هەروەها فێری مۆسیقاشی کردووم.

❊ لارا خان، تۆ کامە ئامێر دەژەنی؟

ـ کەمانچە.

❊ ئەی تۆ تارا خان؟

ـ ئۆرگ.

❊ دوا وتەت ئەگەر هەتبێ تارا خان؟

سوپاسی مامۆستایان وشیار مەرجان و فەرهەنگ غەفوور دەکەم و سوپاسی گۆڤاری ئاسۆی منداڵانیش دەکەم.





لارا مەجید



لارا و تارا
لەگەڵ بەڕێوبەری گشتی
پەروەردەی هەولێر
لە کاتی کردنەوەی
پیشانگادا







هەندێك لە تابلۆکانی تارا







هەندێك لە تابلۆکانی لارا

# کەروێشکێکی زیرەك

و/ لە ئینگلیزییەوە:
بێخاڵ کاکل توفیق





چەندین ساڵ لەمەوبەر لە دارستانێکی بچووکدا، کۆمەڵە گیاندارێك بەیەکەوە دەژیان.
یەکێك لە گیاندارەکان شێرێکی بەهێز بوو، کە هەرکاتێ برسی بوایە پەلاماری یەکێك لە گیاندارەکانی دەدا و دەیخوارد.
بەمجۆرە مەترسیێ بۆ ژیانی ئاژەڵەکانی دارستان دروست کردبوو. ڕۆژێکیان هەموو گیاندارەکان کۆبوونەوە و چوونە لای شێرەکە و پێیان گوت:
((گەورەم، ئێمە دەزانین تۆ سەرۆکی ئێمەیت و لە هەمووومان بەهێزتری، بەڵام هیچی تر پەلامارمان مەدە، ئێمە بەڵێنت پێ دەدەین کە هەریەکێك لەئێمە ڕۆژانە خواردنت بۆ ئامادە بکات، ئەگەر نەیتوانی، ئەوکاتە هەقی تۆیە)).
شێرەکە بەقسەی گیانداران ڕازی بوو..
بەم شێوەیە هەر ڕۆژەی گیاندارێك خواردنی بۆ شێرەکە دەهێنا. تا ڕۆژێکیان نۆرە گەیشتە سەر کەروێشك، بەڵام کە کەروێشك چوو بۆ ڕاو، نەیتوانی هیچ ڕاو بکات، بۆیە بە دڵتەنگی بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە.



شێرەکەش هەر چاوەڕوان بوو، بەڵام کەروێشکەکە هەر نەگەڕایەوە.
دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر، کەروێشك هاتە لای شێرەکە و گوتی:
ببوورە گەورەم، تووڕە مەبە. من خواردنم بۆ هێنای، بەڵام لەڕێگای گەڕانەوەمدا تووشی شێرێکی دیکە بووم و خواردنەکەی لێ ستاندم.
شێرەکە زیاتر تووڕە بوو و نەڕاندنی:
- پێم بڵی شوێنی لە کوێیە؟
کەروێشکەکە شێرەکەی بۆ لای بیرێکی قووڵ برد، کە پڕبوو لە ئاوی خاوێن، بەشێرەکەی گوت:
- گەورەم، یەکەمجار ئەو هێرش بۆ تۆ ناهێنێت.
کاتێك شێرەکە سەیری ناو بیرەکەی کرد، وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا بینی، وایزانی ئەوە دوژمنەکەیەتی، یەکسەر خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکەو خنکا.



بەم چەشنە، بەهۆی زیرەکی و وریایی کەروێشکەکە، گیاندارانی دارستان لە زوڵمی شێرەکە ڕزگارییان بوو و بەخۆشی و شادی ژیان.

# گەشتەك ل ئاسمانێ کوردستانێ



لاوەند: هەوە دڤێت بالۆنێ بەرەف کیژ لایی ببین ؟

سارا : بە دڵتە .

سۆلین : یەکەمین جارمانە وڵاتمان لە ئاسمان ببینین ،

بەرەو کام لامان بیبەن باشە ؟

لەیلان: ئامێدییێ باژێرەکی خۆشە .

لاوەند : دا بەرەف وێرێ بچین.

سارا : ئەم ئاوە جوانە چییە !؟

سۆلین : وابزانم ئێرە سۆلاڤە،

چونکە خوێندومەتەوە سۆلاڤ لە ئامێدی نێزیکە.

لەیلان : بەلێ ، ئەڤە سۆلاڤە .

لاوەند : ما هوون نابینن یا هە ئامێدییێ یە ژ دوورڤە یا دیارە!

سارا : ئەمە شارە ! یان قەڵاتە ؟

سۆلین : ئامێدییێ شارێکی کۆنی کوردستانە و لە شوێنێکی بەرزە، وەکو قەڵات وایە .

لەیلان : دبێژنێ میرگەها بەهدینا .

لاوەند : دێ وەرە بەرێ خۆ بدەنە دەرگەهێ ئامێدییێ و منارا وێ یا دێرین و مەدرەسا قوپان

ب راستی ئەڤە شارەکی دیرۆکی و گەشتوگوزارییە.



نووسینی : پەخشان حەمەمیرزا
نیگار : دڵشاد عەلی

# یەکەم ڕۆژی قوتابخانە

ژیرۆ هەر سەر لە ئێوارەوە لەم ژوور بۆ ئەو ژوور بەدوای ئەژی و بناری براو خوشکەکەی کەوتبوو، چاوە گەشەکانی بەم لاو ئەولادا دەسووڕان تاکو لە هۆکاری سەرقاڵی و هاتوچۆکردنی خوشك و براکەی بگات، چونکە ڕۆژانی تر هیچ شتێك نەدەبووە هۆی ئەوەی کەیاری لەگەڵ نەکەن و ئاوا بەتەنها جێی بهێڵن، بۆیە ئەوەندە دوایان کەوت تا هیلاك بوو و دەستی بەگریان کرد. هەرچەندە دایکی هەوڵی ژیر کردنەوەی دا، بەڵام نەیتوانی، چونکە ژیرۆ هێشتا منداڵە و نەیدەتوانی قسەبکات تاوەکو وەڵامەکەی لەدایکییەوە بزانێت، ئەوەندە گریا تا خەو بردییەوە. بەیانی بەدەم چپەچپی خوشك و براکەی خەبەری بۆوە، پێی سەیربوو ئەم بەیانییە بۆ وا زوو هەستاون و بەرچایی دەخۆن و بەرگی تازەیان پۆشیوە، ئەی ئەم شتە چییە دایان بەکۆڵیاندا ؟ ئەوە خۆ دەڕۆن و من نابەن! ئەژی و بنار هاتنە پێشی و ئەملاوئەولایان ماچ کرد و گوتیان ژیرۆ گیان ئێمە دەڕۆین پاش چەند سەعاتێکی تر دەگەڕێینەوە، یاریت لەگەڵ دەکەین، بەڵام دەبێت ئێستا بڕۆین، چونکە ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژی کردنەوەی قوتابخانەیە، ژیرۆش دەستی بەپێکەنین کرد.



# پێنووس و ڕەشکەرەوە



جارێکیان ڕەشکەرەوەیەکی بچووك وپێنووسێکی جوان کەوتنە قسەوگفتوگۆ:
ڕەشکەرەوەکە بە پێنووسەکەی گوت:
- هاوڕێم چۆنیت؟
پێنووسەکە وەڵامی دایەوە:
- من هاوڕێت نیم!
- بۆچی؟
- لەبەر ئەوەی ڕقم لێت دەبێتەوە.
- جا بۆچی ڕقت لێم دەبێتەوە؟
پێنووسەکە گوتی:
- چونکە هەرچی من دەینووسم تۆ دەیسڕیتەوە.
- بەڵام من تەنها هەڵەکان دەسڕمەوە.
- جا بۆچی وا دەکەیت، چ پەیوەندی بە تۆوە هەیە؟!
- من ڕەشکەرەوەم وئەمەش کاری منە.
- ئەمە کار نییە.
- کاری منیش سوود بەخشە وەکو کاری تۆ.
- تۆ هەڵە ولەخۆباییت.
- بۆچی؟
- چونکە ئەوەی دەنووسێت، چاکترە لەوەی کە دەسڕێتەوە.
ڕەشکەرەوەکە گوتی:
- سڕینەوەی هەڵە هاوسەنگ وبەرامبەرە لەگەڵ نووسینی ڕاست وبێ هەڵە.
پێنووسەکە هەندێ بیری کردەوە وپاشان سەری بەرزکردەوە وگوتی:
- ڕاست دەکەی خۆشەویستەکەم!
ڕەشکەرەوەکە گوتی:
- ئێستاش ڕقت لێمە!
- ڕقم لە یەکێ نابێتەوە کە هەڵەکانم بسڕێتەوە.
-منیش شتێ ناسڕمەوە کە هەڵە نەبێ و ڕاست بێ.
پێنووسەکە گوتی:
- بەڵام من دەبینم تۆ ڕۆژ بەڕۆژ بچووك دەبیتەوە!
- چونکە من هەر جارێك کە هەڵەیەك دەسڕمەوە، قوربانی به بەشێك لە لەشم دەدەم.
پێنووسەکە بە غەمبارییەوە گوتی:
- منیش هەست دەکەم هەر وردە وردە کورتتر دەبمەوە!
ڕەشکەرەوەکە دلی دایەوە وگوتی:
- ئێمە ناتوانین سوود ببەخشین بە ئەوانی تر، تاوەکو قوربانی لە پێناویاندا بەخۆمان نەدەین.
پێنووسەکە بە خۆشحالییەوە گوتی:
- هاوڕێیەکەم تۆ چەند دلسۆزیت، وقسەکانت چەند جوانن!
ڕەشکەرەوەکە وپێنووسەکە زۆر دلخۆش بوون وهەردووکیان وەکو دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی پێکەوەژیان،
ئیتر هەردووکیان هەرگیز لە یەکتر دوور
نەکەوتنەوە وبیروڕاشیان جیاواز نەبوو.

و. لە عەرەبییەوە :
محەمەد عەبدولرەحمان

# چالاكییەكانی

## ئاهەنگا زارۆكان



باغچێ سەرسنگ یێ ساڤایان
ئاهەنگەك بۆ دەرچوویێن خۆ
سازكرد  ب خۆشی و شادی
ئاهەنگا جوان گێڕا ب سروود
و شیعر و پارچێن زارڤەكرنێ
و چالاكییێن هونەری.

## پیشانگایەكی  نیگاركێشانی منداڵان لە هەولێر



ڕۆژی ( ٢/٨ / ٢٠٠٥) لە هۆڵی چالاكی
قوتابخانەكان، پیشانگایەكی نیگاركێشانی
منداڵان  بۆ ژمارەیەك لە قوتابیانی
قوتابخانەكانی سەرەتایی ناو شاری هەولێر
كرایەوە،  تێیدا چەندین بەرهەمی وێنەكێشانی
منداڵان پیشان دران.

# قوتابیان

## لە شەقڵاوە خەڵاتکردنی قوتابییە یەکەمەکان



ڕۆژی ( ٢١/ ٨/ ٢٠٠٥) لە ڕێوڕەسمێکی خنجیلانەدا بەڕێوەبەری پەروەردەی شەقڵاوە خەڵاتی بەسەر چوار قوتابی یەکەمی سنووری پەروەردەی شەقڵاوە لە هەرسێ قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی دابەش کرد. ئەمەو قوتابی مارینۆ عەبدولجەبار هاویل لە پۆلی شەشی سەرەتایی لە سنووری پەروەردەی شەقڵاوە لەسەر ئاستی هەرێم پلەی یەکەمی بەدەست هێنا بوو.

## دەواما هاڤینێ ل قوتابخانێن پەروەردا ئامێدیێ

ل پەروەردا ئامێدیێ دەواما هاڤینا قوتابیان ل چەندین قوتابخانەیێن سەرەتاییدا بەردەوام بوو و، درەوشەکا گەلەك باشدا بڕێڤە چوو و چەندین چالاکییێن جوداجودا هاتنە ئەنجامدان ، ب ئەڤێ هەلکەفتێ ژی ڕێڤەبەرێ پەروەردا ئامێدیێ خەلات لسەر قوتابییێن بەشداربووی بەلاڤکرن.



ئا : ئاسۆی مندالآن
نیگار: ئاواز کەریم



## چیرۆکا

# سەی و هەستی

وەرن دا ل گورەی زنجیرا ڤان پێنج وێنەیان
چیرۆکا سەی و هەستی لێکبدەینەڤە و
ب ڕێز ڕەنووس ل بن وێنەیان دانێن .









# شەمالك فرۆش

نڤیسینا : عەبدولعەزیز سلێمان - زاخۆ



شەمالك - شەمالك - وەرنە شەمالكا - وەرنە شەمالكا

شەمالك فرۆشم - ئەز نوژدارێ ئەقل و هوشم

وەرنە شەمالكا - شەمالكێن من رۆناهی نە

وەرنە شەمالكا - شەمالكێن من بیناهی نە

شەمالكێت من ئاڤا دكن وەلاتا

شەمالكێت من پێشڤەدبن میللەتا

وەرن خۆ ڤەنەدن ژ رۆناهی یێ پێشكەتن و سەركەتن و ڤێ ژیانێ ڤێ خۆشییێ وەرن.. وەرن .. وەرن.



كەسێ یەكێ : مامێ شەمالك فرۆش.. كا یەكێ بدە من .

شەمالك فرۆش : ها ئەڤە دەرمانێ چاڤایە .

كەسێ دووێ : یەكێ بۆ من ژی.

شەمالك فرۆش : بگرە ئەڤە دەرمانێ مەژیێ تەیە .

كەسێ سیێ : كا بۆ من ژی ئێكێ

شەمالك فرۆش : بگرە دا تو تێر بخۆی .

كەسێ چوارێ : كا بۆ من ژی

شەمالك فرۆش: ها بگرە.. دا تو باش خۆ ناس بكی .

كەسێ پێنجێ: كا بۆ من ژی .

شەمالك فرۆش : ئەڤە ژی بۆتە و هەمی بنەمالاتە .

هەمی پێكڤە: راستە ئەڤە رۆناهی یە . راستە ئەڤە رۆناهی یە.

خاندن ئەقلٚ و هوش و ژینە وەرە وەرە تو بخوینە

یێ نەخوێنت پاشكەتییە .. ژینا وی هەردەم تارییە

لڤێ جیهانێ كەس ناسناكت .. بێ ئومێدە و بێ هێڤی یە .



هەمی پێكڤە : دا هەلبكین شەمالكا- دا هلبكین شەمالكا ..

كەسێ یەكێ: ئەز باش دبینم هەمی دنیایێ .

كەسێ دووێ: بخودێ هەمی تشت هاتنە بیرا من .

كەسێ سێیێ: ئەژی ساخبیم و تێر خارنێ دخۆم .

دا بخوینین - دا ببینین - باش بخوینین

خواندن تاجا زێرینە . لسەر سەرێ زانایە

# نوكتەبازى قوتابيان




قوتابييەكى نەشيا بوو بەرسڤێن تاقيكرنێ بدەتەڤە، ئينا لسەر كاغەزا تاقيكرنێ نڤيسيبوو: مامۆستا ئەزێ نەخۆشم !
ئەو رۆژا ئەنجامێن تاقيكردنێ هاتينەڤە، ناڤێ ئەوى قوتابى دگەل دەرنەچوويان هاتبووڤەوە، ل بەرانبەر نڤيسيبوو:
خودێ سەلامەتيێ بدەت.

مامۆستاى بيركارى : ١+ ١دەكاتە چەند ؟
قوتابى : ٣
مامۆستا: باوكت چ ئيشێك دەكات ؟
قوتابى : كەبابچييە.
مامۆستا : ئەگەر نازانى ( ١+ ١) دەكاتە چەند، ئەى يەك شيش كەباب + يەك شيش كەباب دەكاتە چەند؟
قوتابى : نيو نەفەر .






مامۆستا گۆتە قوتابييەكى:
ب ئينگليزى هەتا (دەھ)ێ بژمێرە؟
قوتابى گۆت :
وەن ،
دوو وەن ،
سێ وەن ،
چار وەن ،
...

# ڕێگای ڕاست بدۆزەرەوە



خۆشەویستان بۆ ئەوەی ئەم منداڵە بگات بەو دۆندرمەیەی کە زۆر حەزی لێیەتی ، نزیکترین ڕێگای بۆ دەستنیشان بکەن.



ئا-لە ئینتەرنێتەوە:
جەزا حەمەلاو







# جیهانی

## هەواڵ و چالاکییەکانی




### بەریکانێن قازان

ل باژێرکێ (مارینۆ) یێ ئیتالی ل نێزیکی باژێری (ڤینیسیا) بەریکانەیەکی سەیر بۆ قازان برێڤەچوو. دڤێ بەریکانێدا ( ١٣٠) سەد و سیە قاز ب هاریکاریا خودانێن وان بەشداری تێداکرن و درێژاهیا وێ ( ٤١٩) مەتر بوو. تێدا قازەك ب ناڤێ (سپارتاکۆس) یاری برەڤە، ئەو ژی شیا بتنێ د ( ٦) دەقیقا و ( ١٤) چرکەیان دا ببڕیت.

### لە میسر ( ١٥٠٠ ) قوتابی گۆرانی بۆ مرۆڤایەتی دەڵێن



قوتابیانی ژمارەیەك لە قوتابخانەکانی قاهیرە لە میانی چالاکییە هونەرییەکانی خۆیاندا ئۆپەرێتی (بۆ مرۆڤایەتی)یان پێشکەش کرد. ئەمەو پتر لە ( ١٥٠٠) قوتابی بەشدارییان لە ئۆپەرێتەکەدا کرد کە ( ٦٠٠٠) بینەر ئامادەی بوون.

# منداڵان



## یاریێن جوان هەڵبژێرن

چەندەك ژ ڤەکۆلەرێن بوارێ بەرهەمهێنانا یاریێن زارۆکان ڕاگەهاندن کو هژمارەکا یاریێن زارۆکان زیانێ دگەهینە سەر تەندروستیا زارۆکی .

نەدووره ژی تەپێن ئیسفەنجی و هندەك ژ ڕەنگێن بویاێن نەینۆکان کو مادەیێن ژەهراوی تێدانە و هەروەسا یاریێن پەقینێ یێن خۆشیێ زیانێ ژی بگەهیننە گوهێ زارۆکی .



## لە ( جۆلان )
## ئاهەنگێك بۆ قوتابییە مۆسیقاژەنەکان

لەناوچەی جۆلان لە سوریا، ئێوارەی ڕۆژی ( ٦/٧ / ٢٠٠٥) ئاهەنگێك بۆ ( ١٣) قوتابی بەهرەمەند لە بواری مۆسیقاژەنی ئامێرەکانی (کەمانە ، پیانۆ ، گیتاری کارەبایی) بەڕێوەچوو.

ئەمەو قوتابی دەسترەنگین عروە عیزەت بەوپەڕی لێهاتوویی ( ٣) پارچە مۆسیقای بە ئامێری پیانۆ ژەنی.

## پرۆژەی ( منداڵی هونەرمەند ) لە فەلەستین



لە شاری حەیفا لە فەلەستین پرۆژەی (منداڵی هونەرمەند) بایەخێکی باشی پێ دەدرێت.

ئەمەو لەو پرۆژەیەدا بایەخێکی تەواو بە هونەری شانۆ دەدرێت، تاوەکو ببێتە تەواوکەرێك بۆ پرۆگرامی قوتابخانەکان.

# پەیڤێن کوردی

هۆنراوەی: کەمال یاسین محەمەد/ شیلادزێ
نیگار : دارا محەمەد عەلی



پەیڤێن کوردی بخوینن
سەرکێشێن ژینێ هوینن
پەیڤێن کوردی ب مفانە
باش دویڤ هەرەو بزانە
پەیڤێن باب و باپیران
قەت نامینن بێ خودان
هەرن نێرنە فەرهەنگا
دێ بینن گەلەك ڕەنگا
کوردین خۆدان زمانین
خامێ زێرین نادانین

# نامەیەکا زارۆیەکێ کوردستانێ

ئەز زارۆکەك دلڤینم
بشکوژەك جوان و ڤینم
ژ کوردستانا شیرینم
هەمی دلا دخەملینم
ناڤێ من ژی کوردڤانە
ئەشقا من کوردستانە
پەلاتینەك ئازادم
گولا زانینێ دخوازم
شەڤ و ڕۆژ هەر دخوینم
دا تەڤ هیڤییا ب جهبینم
سەرکەفتی بێ یەکێ بم
پڕ زانین و زانست بم
پێشەڕوژێ دابین کەم
دلی دەی بابا شاد کەم
وارێ خۆ هەر ئاڤا بکەم

هۆنراوەی: کەمال ڕەمەزان ئاکرەیی



ئازیزان ..
بەمەبەستی ئاشناکردنتان بە سایتە ئەلیکترۆنییەکانی تۆڕی جیهانیی ئینتەرنێت، لە هەر ژمارەیەکدا ماڵپەڕێکی پەروەردەیی و زانستی و ڕۆشنبیریی منداڵانتان بۆ پێناسە دەکەین .




## سایتی شاری یارییەکان

سایتی شاری یارییەکان ( arcadetown) کە بە زمانی ئینگلیزییە، چەندین یاری هەمەجۆر لەخۆ دەگرێت، وەکو یاری وەرزشی و سەرکێشی و ڤیدیۆیی و، هەندێ لەو یارییانەش بەخۆڕایی وەردەگیرێن.
ناونیشانەکەشی بەم شێوەیەیە:
www.arcadetown.com




## سایتی گەنجینە زانستییەکان

سایتی گەنجینە زانستییەکان (Treasure-troves )
بریتییە لە ئنسکلۆپیدیایەکی بەربڵاو لە زانستە هەمەجۆرەکان کە بە زمانی ئینگلیزییە و، بابەتەکانی گەردوونناسی و کیمیا و فیزیا و زیندەوەرزانی دەگرێتەخۆ.
ناونیشانەکەی بەم شێوەیەیە:
www.treasure-troves.com

کامیرا گوڤاری



# ل باخچێ ئاژەلان



بژار : دا بچینە مال نێزیکە دێ بیتە شەڤ و دێ تاری بیت.

ئالان : پێنج (دەقان) دا ڕاوەستین و زوی کامیرێ بدە من دا وێنێ دووماهیکێ بگرم

بژار : وێنێ چی ؟

ئالان : ئەڤ چەکچەکیلە (شەمشەمەکوێرە) یا لسەر دارتیلێ.

بژار : دێ لێ کەری. تو نابینی سەرنشیڤە وێ مری!

ئالان : نە هەڤالێ من.. نە ! ئەو ژ من و تە ساخترە.. ئەو بڤو وەدکەت و کەلەک جاران سەر نشیڤ ڕادوەستیت.

بژار : ئەری تو نابێژیە من بۆچی ب ڕۆژێ دیار نابت و ئەڤە دێ بیتە شەڤ ژ نوی دیار کەفتن.

ئالان : پێکهاتا چاڤێت وێ وەلی کرینە ب شەڤ باش ببینن و ب ڕۆژێ کێم دبینن

بژار : پا چەوان تشتا دبینیت دا بڤوت ؟

ئالان : هەستا کوهلێبوونا وان کەلەک بهێزە.

دشێت کوه للڤینێت وان ئاژەلێن بچووک بیت و پاشی بگرت و بڤوت .

بژار : ئەز دبێژم حەز ژ خوارنا ماسیان ژی دکەت .

ئالان : تو دزانی چەکچەکیلە دزێت و هێلکا ناکەت ؟

بژار : ئەرێ ، سالێ بتنێ یەک جار دزێت و یەک تێشکێ دکەت.

ئالان : ژ یێ وێ دگەهیتە بیست سالیێ.

# ئاوێنەی وەرزش

## ڕێنمایی وەرزشی

لەکاتی لێدانی کۆرنەردا، دەبێ بەشێوەیەکی کەوانەیی لەتۆپ نزیك بکەوینەوە، نەك بەشێوەیەکی ڕاست و، دەبێ بە بەشی لاتەنیشتی پێڵاویش شووت لەتۆپەکە بدەین.




## بۆ زانیاریت

ژمارەی پێوانەیی لەئەنجامدانی مەشقی (نووشتاندنەوەی کەمەر) بۆ پێشەوەو دواوە، لەسالی ( ١٩٧٢) لەلایەن منداڵێکەوە بەناوی ڕیچارد جۆن نێشت لەیەکێك لەویلایەتەکانی ئەمریکا تۆمارکرا. ئەمەو ئەو منداڵە توانی لەماوەی ( ١١) کاتژمێرو ( ١٤) خولەکەدا، ( ٢٥٢٢٢) جار ئەم مەشقە ئەنجام بدات.





## سەیرو سەمەرەی وەرزشی

لەسالی( ١٩٧٦) لەشارۆچکەی گابور لەوڵاتی هیندستان، بۆ یەکەمجار فیل لەجیاتی ئەسپ لەیاری پۆلۆ بەکارهێنرا. ئەمەو ( ٤٠) هەزار بینەر سەیری ئەو یارییە نوێیەیان کردو، خۆشحاڵ بوون بەهۆی ئەو گۆڕانکارییە سەیرەی کە لەیارییەکەدا بەدیهات.

# گەلەریی قوتابیان







وەلا شێروان عەبدولقادر
باخچەی تیرۆژک
دهۆک



ئەڤین فرسەت
پۆلا دوێ
قوتابخانا زۆزک
یا سەرەتایی/ دهۆک







ئەمین عەبدوللا خەلیفە
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی بارا ژێریێ
شنگال





ئەحمەد حاجی سادق
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی بەدلیس/ دهۆک



سەگڤان ئیبراهیم
پۆلا دووێ
قوتابخانا بەیان سەرەتایی
یا هاوری / پەروەردا سێمێلێ



هێسا مەلا ئەحمەد
پۆلی چوارەم
قوتابخانەی فاتیمەی زەهرای
سەرتایی/ هەولێر







ژاڵە شەمسەدین یونس
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی قەدەم خێری
سەرەتایی-هەولێر



ئاسیا کەمال
چوارەم
قوتابخانەی ئاگری داغی
سەرەتایی- هەولێر






شەیما جەلیل ئیبراهیم
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی هەلۆی
سەرەتایی- هەولێر





حەلیمە خەلەف غەریب
قوتابخانا ئومێد
شنگال



ئایە نیهاد عزەدین
پۆلی دووەم
قوتابخانەی جەواهیری
سەرەتایی- هەولێر





بەناز عەلی ئیبراهیم
پۆلی سێیەم
قوتابخانەی ماکۆکی
سەرەتایی - هەولێر







ماجدە خەلەف خدر
قوتابخانا ئومێد
شنگال